نازم حیکمەت

# چەند نامەیەک بۆ تارانتابابۆ

نەژاد عزیز سورمێ

کردوویە بە کوردی

چاپی سێیەم 2005



* چەند نامەیەک بۆ تارانتابابۆ
* نەژاد عزیز سورمێ کردوویە بە کوردی
* ئەم شیعرە لەکاتی خۆیدا لە گۆڤاری (گزنگ)ی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکووک لەشاخ بەناوی خوازراوی (کوێستان حوسێن کەریم) بڵاوکراوەتەوە.
* بەرگ و کۆلاژەکانی ناوەوە: نەژاد عزیز سورمێ
* نەخشەسازی: شکار نەقشبەندی
* چاپی یەکەم بەغدا 1990
* چاپی دووەم سوید کتێبی ئەرزان 1996
* چاپی سێیەم 2005- هەولێر-کوردستان
* ژمارەی سپاردن: 485
* چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی کوردستان

## ئەم داستانە شیعرییە

**کاک نەژاد عزیز سورمێ، سیایی ئەم داستانی (تارانتابابۆ)یەی نازم حیکمەتی لە عەرەبییەوە کردووە بە کوردی، رووی لێنام لەگەڵ ئەسڵە تورکییەکەیدا بەراوردێکی بکەم، منیش لەبەر یەکیانم گرت، لە مەبەست و ناوەڕۆکدا، لەچەند شوێنێکدا نەبێ کە گوناهی وەرگێڕە عەرەبییەکەیەتی هیچی کورت نەهێناوە.**

**کاک نەژاد بۆ خۆی شاعیرە، هەوڵیداوە داستانەکە شاعیرانە وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی، کە پێم وایە لە عەرەبییەکەی چاکترە.**

**هیوادارم خامەی هەروا بەبڕشت و رەنگین بێ و بە وەرگێڕانی شتی تاسووق و بەدانیسقە زاخاوی دڵ و مێشکمان بدا.**

**شوکور مستەفا**
**بەغدا -1987/4/2**

# چەند نامەیەک بۆ تارانتابابۆ

ماوەیەک لەمەوبەر نامەیەکم لەبرادەرێکی ئیتاڵییەوە پێگەیشت، بەستەیەکی پێوەبوو. ئەو برادەدرە لەبەر ئەوەی وەک خۆی دەیەوێ نەیتوانی بوو زمانەکەی خۆی لە وڵاتی خۆیدا بەکاربێنێ، پەنای بۆ زمانە ئاسیایی و ئەفریقیاییەکان بردبوو.

نامەوێ ناوی برادەرەکەم بێنم، چونکە لەوانەیە ناوهێنانی تووشی بەڵایەکی بکا.. بەڵام نامەکەی وەکو خۆی دەنووسمەوە:

«برام... تۆ رۆما لەکارتی پۆستەو وێنەی لەچاپدراوی نێو کتێبەکانی مێژوو و جوگرافیاوە دەناسی.. دەروازە سێ



دەریەکانی کە ئەستووندەکانی کۆتەڵی و قرِاڵ و پۆلی سەربازانی لێ تراشاوە. (کۆلیسیۆم)«1»یش دەڵێی بێژینگێکی زلەو مشک رۆخەکانی کرتاندووە. مەیدانی کلێسەی قەدیس پەترۆس و کۆترەکان.. باڵەخانەی (پلازا ڤێنیزیا)و بانیژەکەی، کە مۆسۆلینی بەدەم داچەقیوییەوە لەسەری دەوەستێ و دەستی راستیشی لە کەلەکێی گرتووەو هی چەپیشی لە هەوایێ.

بەڵام رۆمایەکی دیکە هەیە، لە رۆمای نێو کارتەکانی پۆستە ناچێ و ئەوان نە وێنەی دەگرن و نە کارتیشی دەفرۆشن، ئەو رۆمایەی دووەم پێی دەگوترێ (کارتیری پۆپۆلاری)«2»، لێرەماڵەکان وێنەی نائومێدی کرێکارێکی بێ ئیشی ئیتاڵیایین، کە نەیتوانیوە بەرەو ئەمریکا کۆچ بکات.. لە تاریکیشدا ئارەقەیەکی لینج و بۆگەنن..

جا چونکێ ئەو گەڕەکانە تەنانەت لە کارتە رەنگاوڕەنگەکانی پۆستەیشدا لە رووناکی بێبەرین، بۆیە نەدەچنە کتێبەکانی جوگرافیاو نە نێو کۆمەڵەی دیمەنە مێژووییە قەشەنگەکانی گەشتوەران.

زاناو بیرتیژی مەزن، مۆسۆلینی بەڕێز، دانیشتووی ڤێلاتۆرلینای یادگاری تۆرلینا بەگ، کە کچەکەی داوەتە (کۆنت شیانۆ)«3» دەوڵەمەندترین و سایەوەترین لاوی ئیتاڵیا، لە ئینسکلۆپیدیای ئیتاڵیدا، لەژێر تیپی (ف-f)دا فاشستایەتی بەم جۆرە دەناسێنێ و دەڵێ: «فاشستی ئەوەیە کە

بەچاوێکی سووکەوە دەڕوانێتە ژیانی سایەوەو بڕوای بەوە نییە بەختیاری لەسەر زەوی دابین دەبێ».

ئەم تیورەی فاشستەکان کە «بەچاوی سووکەوە دەڕواننە ژیانی سایەوەو بڕوای وایە بەختیاری مرۆڤایەتی لەسەر رووی زەمیندا مەحاڵە»، بەوپەڕی دڵسۆزی و گەرموگوڕییەوە بەسەر گەڕەکە میللییەکاندا سەلمێندراوە. وەک دۆتچی بنیتۆ مۆسۆلینی و برادەرە گیانی بەگیانییەکەی (تۆبلێتز، بەڕێوەبەری بانقی بازرگانی و قڕاڵی نێو پارەدەرەکانی ئیتاڵیایش هەر لەژێر تیپی (ف-f)دا فاشستایەتی بەم جۆرە دەناسێ:

«لە لای فاشی هەمووشتێک لەنێو چوارچێوەی دەوڵەتدا دەبێ و لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیەشدا هیچ شتێکی مانەوی و مرۆڤایەتی نرخی نییە».

جا بۆ ئەوەی لە رادەی چەسپاندنی ئەو روانینە قووڵ و خڕگرەوەی فاشستایەتی بگەین، دەبێ بۆ لای ئەوانە شۆڕبینەوە نیشتەجێی ئەو گەڕەکە میللییانەن، نەک بەرەو ئەوانە هەڵکشێین کە لە ساڵۆنەکانی ئوتێلی (برتۆلینۆ سپلاندت)ی رۆشنتر لە خۆرەکانی ئیتاڵیا کۆبوونەتەوە. دانیشتوانی ئەو گەڕەکانە بەتین و تاوێکی فرەوە لە زیندانەکانی دەوڵەت و دەفتەرخانەکانی باج ستاندن و پۆلیسخانەکانەوە ئاخنراون و بەراستیش بەسەریاندا سەپێنراوە، ئەوەی لە دەرەوەی دەوڵەتدایە هیچ نرخێکی نییە.

کاتێ رزگارکەری ئیتاڵیش، فاشستایەتی لە ئینسکلۆپیدیای



ئیتاڵیدا لەژێر تیپی (ف-f) دەناسێنێ، ئەوە بەڵگەی ئەوەمان دەداتێ کە ئینسکلۆپیدیا بەناوبانگەکان ئاسەواری زانستین و بابەتیانەو بەبێ لایەنییەوە نووسراون(!!) دەڵێ: «ئەو ژیانەی فاشی تێی دەگات ژیانێکی بەهادارو بەهەند هەڵگرو شکۆمەمەندە..»، ئەمەیش بەڕاستی راستە، چونکە بەهەزاران تەنفرۆشی برسی نەک هەر لە گەڕەکە میللییەکانی رۆما، بەڵکو لەهی شارو لادێیەکانیش ئەو ژیانە بەهادارو شکۆمەندو بەهەند هەڵگرە دەژین، کە فاشستایەتی نوقڵانەی بۆ لێدەدات.

بەڵام لێم گەڕێ باتێت بگەیێنم: (بەداخەوە) زۆربەی دانیشتوانی گەڕەکە میللییەکان لەزمانی ناو ئینسکلۆپیدیان ناگەن... ئەوان بەپێی تێگەیشتنی خۆیان فاشیایەتی دەناسن، باوەکو کەمتر بەهادارو بەهەند هەڵگریشە، ئەوان لایان وایە یەکگرتنی هێزە کۆنەپەرست و بۆرژواو ئیمپریالییەکان لەژێر کاری هەلومەرجی دیاریکراوەوە بەهێزدەبێ و دەبێتە فاشیایەتی...

کەواتە فاشیایەتی دیکتاتۆرییەتێکی ئاشکرایە، کە سەرمایەداری لەپاڵ دروستکردنی کۆنەپەرستی و شۆڤێنیایەتیدا دروستی دەکات.

گرینگترین ئەو مەرجە مێژووییانەیش فاشیایەتی پەیدادەکەن، ئەو هەڵکشان و داکشانانەن تووشی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان دەبن و زۆربەی زۆری بۆرژوای لادێ و شارە بچکۆلەکان دەکەونە بەر چڕنووکی هەژاری و ترسی زۆر لە وریابوونەوەی پڕۆلیتاریا.

دوو حەفتە لەمەوبەر چوومە گەڕەکی (گاریاتێلا)، کە یەکێکە لە گەڕەکە میللییەکانی رۆما، ئەو گەڕەکەی وشک و ناشاعیرانە فاشیایەتی دەناسێ، لە دەرگای ماڵێکی سێ نهۆمیم دا، لەو ماڵانەی ژوور بەکرێ دەدەنە هونەرمەندو زاناو قوتابی هەژارو کرێکاری رەبەن، ئەوانەی هێشتا لەگەورەیی فاشیایەتی نەگەیشتوون!

بەدەرگەوانەکەم گوت: دەمەوێ ژوورێک بگرم. ئەویش بۆ نهۆمی دووەمی سەرخستم و ژوورێکی پێ نیشان دام، منیش پێی قایل بووم.

ژووری بەکرێیش وەک جلوبەرگی بەکرێ وایە، لە هەردوو بارانیشدا یەکەم پرسیارێکی بەخەیاڵم دابێ ئەوەیە: بەر لە من کێ ئەو جلوبەرگانەی پۆشیوە؟ یا کێ لەپێش من لەو ژوورەدا بووە؟.

لەسەر رۆخی پێخەف دانیشتم لە دەرگەوانەکەم پرسی:

– پێش من کێ لەم ژوورەدا بووە؟

ئافرەتەکە دەتگوت دەرزی ئاژەن کراوە! لە هیکەوە راپەڕی و بە دوو دڵییەکەوە سەیری کردم، ئینجا گوتی:

– دیارە پێیان نەگوتووی؟.. ئەوە دوو رۆژە گرتوویانە!..

هیچی لێ تێنەگەیشتم، بەڵام دوای ماوەیەک سەرسوڕمان، مەسەلەکەم بۆ روون بووەوە، وا تێگەیشتبوو منیش یەکێکم لە پۆلیسە سیخوڕەکانی رۆما. ئەوەی دوو رۆژ لەمەوبەریش



گرتبوویان لاوێکی حەبەشەییە، دەرگەوانەکە دیاربوو لەسەری رۆیشت:

لاوەکە زنجییەکی هۆزی گالای بت پەرست بوو،ساڵێک لەمەوبەر ئەو ژوورەی بە کرێ گرتبوو، گوتبووی کە بۆ خوێندنی هونەری وێنەگرتن هاتووەتە ئیتاڵیا. دیاربوو دەرگەوانەکە خەمی کەوتبووە بەر وای دەزانی لەبەکرێگرتنی ژوورەکە پەشیمان دەبمەوە.

دوای ئەوەی ئەم هەمموو هەواڵانەم لێ بیست، ئینجا بەدرێژی باسی ئەوەی کرد، کە چۆن دوای بردنی زنجییەکە ژوورەکەی پاککردووەتەوە، تەنانەت ئاسنی چارپایەکەیشی پاکژکردووەتەوە، پێم گوت: من لە بەکرێگرتنی ژوورەکە، هەر لەسەر بڕیاری خۆمم.

کە ئێوارە بەخۆو بەجانتاو کتێبەکانم گەڕامەوە، تێگەیشتم کە من لەبەرچاوی ئەو ئافرەتە لە قارەمانێک دەچم، چونکە گوێ بەوە نادەم لە ژوورێکدا بژیم پۆلیس پشکنییەتی و پیاوێکیان لێوە بردبێ.

کە بە تەنیا لە ژوورەوە مامەوە، یەکەم شتێکی کردبێتم ئەوەبووە، لەنێوەڕاستی ژوورەکەدا بێ جووڵە وەستام.. پاشان لەسەر پێخەفەکە راکشام و کەوتمە بیرکردنەوە..

ئەو جێیەی کە ئێستا لەسەری رادەکشێم، ساڵێکی تەواویش ئەو لاوە گالاییەی لەسەر راکشاوە.. نیگام لەسەر خاڵێکی سەر

کاریتەی بنمیچەکە راگرت کە بێگومان نیگای ئەویشی لەسەر نیشتووە.. لەپاڵ سەری رووتاویشمدا، سەری ویم بەپرچە رەش و بەگڵوازەکەیەوە دەهاتە بەرچاو، شوونی بەری دەستە ناسک و پەمەییەکانی لەسەر ئاسنی چارپایەکە مابووەوە.. ئەو چارپایەی بەتەواوی پاگژ کرابووەوە!.

هەستامەوە دانیشتم، زانیم لەژوورەوەدا، بە تەنێ نیم، چونکە بڕواناکەم مرۆڤ لەژوورێکدا هەست بەتەنیایی بکات، ساڵێکی تەواو کەسێکی دیکەی تێدا بووبێ بجووڵێتەوە.. هەناسە بدات.. بیربکاتەوەو گۆرانی بڵێ..

لەوانەیە دوێنێ شەو بە بەر رێژنەی گوللان کەوتبێ، یا ئەمشەو بەربکەوێ..

گرتن و پەلکێشکردنیشی لەم ژوورەدا بەرەو مردن، نەمری پێدەبەخشێ، مادەم ئەم چوار دیوارانە بەپێوە ماون.

ناکاو هەستم بەخۆشەویستی و رێزێکی زۆرەوە کرد بۆی، دەتگوت چەندین ساڵ پێکەوە بیرمان کردووەتەوەو لەشەڕدابووین و گۆرانیمان چڕیوە.

کورسییەکەم بەرەو مێزی ناوەڕاستی ژوورەکە راکێشا، ئەوەی کە ئەو لەسەری دادەنیشت، ئانیشکم دایە سەر هەمان جێگەی ئانیشکە ئەبەنووسییەکانی دەخستە سەر.

حەبەشە وڵاتێکی نیمچە دەسبەسەرە، ئەویش زنجییەکی گالاییە، گالایش شوێنێکی ژێردەستەی نێو نیمچە



دەسبەسەرەکەیە.. وەلێ من، کۆیلەیەکی سپی ئیمپریالستی نێو کراسێکی رەشم رووی دایکمم نەدیوە، کە منی بوو مرد، رووی ئەو لاوە زنجییەشم نەدیوە، چونکە لەو دەرگایەوە پەلکێشیانکرد منی پێدا هاتمە ژووری.

هەستم کرد بە ئەندازەی دایکم لێمەوە نزیکە.. هەست بەنزیکی کردنیش بارێکە مرۆڤ گەر بتوانێ دەیەوێ بەدەست بیگرێ و ئەو یادگارانەی لەکەسێکەوە ماونەتەوە بیانهێنیتەوە بەرچاو، هەمان هەست دەدەنەوە مرۆڤ.

بیرم کردەوە.. دەبێ شتێ لەو مرۆڤە مابێتەوە ببینرێ یاخود دەستی بگاتێ، من وا هەست دەکەم لێمەوە نزیکە.. هەست بە دەستەکانی دەکەم لە هەوادا وێنەی چەند گەڵایەکی نادیارو راوەستاو وان..

دۆڵابێکی چکۆلانە لە تەنیشت چوارپایەکەوە داندرابوو.. بۆی هەستام و چەکمەچەی بنەوەیم کردەوە بەتاڵ بوو، هی سەرەوەیم کردەوە کۆنە رۆژنامەی لە ناوەوە راخرابوو.

لەکاتی گەڕان و پشکنینی زۆرو وردەوە، شتە گرینگەکەی بۆی دەگەڕێی هەمیشە لەجێی وادا دەبێت بەخەیاڵی کەسدا نایێ.

رۆژنامەکانی ناو چەکمەچەکەم بەرزکردنەوە، شتە لەبیرکراوەکەم ئەوەی لەو شوێنەی بەخەیاڵی ئەوانەشدا دا نایێ کە زۆر بەوردی بۆی دەگەڕێن مابووەوە، دۆزییەوە. بەستەیەک کاغەزبوو، بەزمانی حەبەشی نووسرابوون، رەشنووسی ئەو نامانەبوون لاوە

زنجییە گالاییەکە بۆ ژنەکەی نووسی بوون، کە پێم وایە بۆی نەناردوون، نامەکانی لاوە زنجییەکە بۆ ژنەکەی نووسیون، کە ناوی (تارانتابابۆ)یە، ئەوەتان لەپێشم، هەندێ لەو نامانە تەواونین، چونکە هەندێ لە کاغەزەکان لەنێوچوون.

کە لە خوێندنەوەی دوا نامە بوومەوە، دونیای دەرەوە روون ببووەوە.. بریقەی زێڕینی گڵۆپە هەڵواسراوەکەی سەر سەرم بەرە بەرە نەدەما، وەک چەهرەیەک خوێنی تیا نەمابێ.

گڵۆپەکەم کوژاندەوە، گەلەک ماندوو بووم، وەک یەکێک سێ شەوو سێ رۆژان رۆیی بێ، خۆم بەسەر جێ (پێخەفەکەی)دادا، ئەو نامانەیشم بەدەستەوە بوو کە بۆ تارانتابابۆی نووسیبوون و نەیناردبوون، ئینجا نووستم و سەری رووتاویشم نزیک سەرو پرچە رەشە بەگڵۆوازەکەی بوو.

نامەکەم تەواو، ئەوا لەنێو ئەم بەستەیەشدا هەمان رەشنووسی ئەو نامانەت بۆ دەنێرم کە بۆ تارانتابابۆ نووسرابوون وەرگێڕانی منیشی لەگەڵدایە، لێرە ناکرێ لە چاپ بدرێن و بڵاوبکرێنەوە، بەڵام تۆ دەتوانی لەوێ بڵاویان بکەیەوە، کەسیش، نە ئەو و نە تارانتابابۆ، تەنانەت منیش ناتوانین کاتێ وەکو کتێب بەتیپی چاپخانە بڵاو دەکرێنەوە تەنها دانەیەکیشی ببینین.

ئەوە ئەویان گوللەباران کرد، ئەو جێیەی تارانتابابۆیشی تیا دەژی لەچەند باڵندەیەکی مەرگ، کە چەند چوار مێخەیەکی خوێناوی ئاسا بە ئاسمانەوە دەفڕن، بەو لاوە.. کەس نایگاتێ تەنانەت پۆستەیش ناتوانێ پێی رابگەیێنێ، وەئەمما من، منیش



لە وڵاتێکدا دەژیم بە هەموو ئەو هۆیانەی بەخەیاڵدا دێن، بەچوار ئیقلیمی دونیایێ بەستراوەتەوە، بەڵام هیچ پاپۆڕێک و فڕۆکەیەکی پۆستەی ئیتاڵیا، یا هەر شەمەنەفەرێکی ئەوروپایی لە توانایدا نییە جارێکی دی نامەکانی (ئارانتابابۆ) بگەڕێننەوە ئیتاڵیا).

ئا ئەوەبوو ئەو نامەیەی لە برادەرە ئیتاڵییەکەمەوە پێم گەیشت، کە ئەویش لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە لە وڵاتی خۆی وەک دەیەوێ بە زمانەکەی خۆی بنووسێ، پەنای بۆ زمانە ئاسیاییی و ئەفریقیاییەکان بردبوو.

بەستەکە ئەو نامانەی تێدابوون کە بۆ تارانتابابۆ نووسراون، منیش دەقەکانی خۆیانم پاراستووە، تەنها وەرگێڕانەکانیانم بڵاوکردوونەتەوە، لەگەڵ هەندێ لەو دەسکارییانەی برادەرە ئیتاڵییەکەم کردوویەتی:



## نامەی یەکەم



**نامەی**
**یەکەم**

تارانتابابۆ!
چاوەکانم، لێوەکانم!
ژنە سێمینەکەم!
کچە بیست و پێنجەمینەکەی بابی.
ئەم نامەیەت،
لە رۆماوە بۆ دەنێرم...
بەبێ ئەوەی لە دڵ بەدەر
چیترم رەگەڵ خستبێ.
لێم نائومێد مەبە هەرگیز
دیارییەکم لە وە چاتر بەدی نەکرد.
کە لەشاری شارانەوە بۆت بنێرم.

تارانتابابۆ!
ئەم شەو دەیەمین شەومە
سەر بەسەر کتێبە زیوییەکاندا دەگرم
لەدایکبوونی رۆما ، دەخوێنمەوە.
سەرەتا گورگێکی ریوەڵە

ئینجا رمۆس و رۆملۆسی رووت و خرپن،
لەژوورەکەم دێن و دەچن..
مەگری تارانتابابۆ!
ئەم رۆملۆسە
سنیۆر«6» رۆملۆسی
بازرگانی مۆری و مەرجانی شین نییە
کە بەنوێژی نیوەڕۆیێ
دەچێتە پاڵ خوشکەکەت
ئەوەی مەمکی
لە دوو هەنجیری بازاڕی
(ئاواڵ ئاواڵ)ـەوە دەچن«7»
ئەوە رۆملۆسی پاشایە
یەکەمین هاونیشتمانی رۆما.



**تێبینی: لەوانەیە لێرەدا لاپەڕەیەک لە نامەکە پەڕی بێ، بەڵام لەم چەند دێڕەی خـوارەوە وادەردەکـەوێ دەربارەی (رۆمـلـۆس) پاشای رۆما بۆ تارانتابابۆ بدوێ.**

شەپۆلەکان بەیەکدا دێن..
شەپۆلەکان،
خۆیان بە کەنارەکانی کۆرسیکادا دەدەن..
کە لە قەدپاڵی ئانتۆم دا
بەرەو دەریای بێ سنوور بانگ هەڵدەدا
چەندی دەستیشی رووەو ئاسمان درێژ دەکا ،
بڕی بروسکەکان دەگرێ و
بە زەمینیان دا دەدا..
وەکو بلێیی کارنێرای«8» مستوەشێن باوکی بێ و
مۆسۆلینی سەرەک وەزیرانیش دایکی..

**تێبینی: نامەکە لێرەدا تەواو نییە، بەڵام لەباسکردنی ئەفسانەی دامەزراندنی رۆما لە لایەن رۆملۆسەوە بەردەوام دەبێ:**

رۆمۆس و رۆملۆس
هەردوو هاوزای سیلیڤاو
هەردوو نەوەی (ڤینۆس)یان
لەتاریکە شەوێکدا
بێ ئەوەی،
گوێ بەفرمێسکی چاویان بدەن
لەسەر لوتکەی چیاوە
هەڵدەشتە خوار..
نە تاجی (غار)یان لەسەر کرابوو
نە قاچیان لەنێو شەلوارێ..
چونکە حەبەشەیش ئەو دەمە
رەنگی سەوزی نەپۆشیبوو
بانقی رۆمایش هێشتا دانەمەزرابوو..
بۆیە سپێدەیەکی زوو
رمۆس و رۆملۆس دەیانپرسی:
«ئێمە ئێستا چ دەکەین لێرە؟».
تووشی دەڵە گورگێک و بێچووەکانی بوون
بێچووەکانیان کووشت،
لە شیری دەڵە گورگ تێربوون.



پاشان چوون رۆمایان دامەزراند..
دایانمەزراند
بەڵام رۆما بێنی لەم دوو پیاوە تەنگ بوو
رۆژێ گۆیا بە هەڵە
کێلەکەوشەنی شارەکەی بەزاندووە..
ئیتر رۆملۆس
سەری (رمۆس)ی برای پەل دا..

وەسایە تارانتابابۆ
ئەوەی لە کتێبە زیوەییەکان،
لەبارەی بەردی بناغەی رۆما هاتبێ
چەند دەفرێکی مشت، لەخوێنی دەڵە گورگێک و
چەنگە خوێنی برایەک...



## نامەی دووەم



**نامەی**
**دووەم**

تارانتابابۆ!
دایکی کوڕی پێنجەم و
کچی سێمینم..
ئەی ئەوەی سێ ملوانکەی ددانی مەیمونێکی شین
گەردنی دەڕازێننەوە..
هۆ ئەوەی لەژێر ئاسمانا
وەک پاسارییەکی پەڕ سوورو
لەسەر زەوی
وەک ئاوێکی ڕەوان دەژی..

ئەی ئەوەی وشەو چاوت
ئاوێنەیەکی ڕەنگ مسی
وشەو چاوەکانیمن..!
ئەوە چەند مانگە
دەرگا نەما نەم کووتابێ،
شەقام بەشەقام
ماڵ بەماڵ
هەنگاو بەهەنگاو
لە ڕۆمادا،
بۆ ڕۆما گەڕام!!



ئیتر لێرە هونەرمەندە بلیمەتەکان چیدیکە
مەڕمەڕ وەکو قوماشی ئاوریشمێ نابڕنەوە..
چیتر باهۆز لە فلۆڕەنسادا هەڵناکا..
گۆرانی (دانتی ئەلیجیری)ش نابیسترێ[9]
ڕووی ڕەنگینی (بیاتریچی)و[10]
دەستی (لیۆناردۆ داڤنیشی)یش- کە ماچ دەکرێ-
نابینرێ..

وەلێ (مایکل ئەنجیلۆ)
بە ئیشی قورس حوکم دراوەو
لەناو مۆزەخانەکاندا سندم کراوە..
(رافائیل)یش
بەملی زەرد هەڵگەڕاوییەوە،
بەدیواری کلێسەیەکدا[11] هەڵواسراوە
ئیتر چیدی لە شەقامە پانەکانی رۆما نییە
لە سێبەرێکی رەشی خوێناوی بەدەر
کە وەکو تەورێکی دوو سەر
بە بانقە کۆنکرێتییەکانەوە پەسێردراوە[12]..
ئەوە قڕاڵە[13]
لەگەڵ هەر هەنگاو هەڵێنانێکی
سەری دیلێک دەپەڕێنێ..
لەگەڵ هەر تێپەڕینێکیش
دێ گۆڕێک هەڵدەکەنێ..



رۆما!
رۆما.. گۆڤادیس[14]؟
کرِبە تارانتابابۆ!
مەپرسە!
وەک خۆری وڵاتمان دیارە
بەخۆشەویستی و
رێزو
پێکەنین و
هاوارەوە.

کرِبە!
ئەوە سپارتاکۆسە
لە دەوروبەری رۆمادا
کۆت و پێوەندی دەپسێنێ..



نامەی سێیەم



**نامەی**
**سێیەم**

تارانتابابۆ!
پاپا(پی) یازدەمینم دی
ئەویش لێرە
وەک جادووگەرە مەزنەکەی خێڵی خۆمانە..
بەڵام جادووگەری خۆمان
کرێ لەباتی راونانی شەیتانی شێن
بۆ ئەودیوی چیای هەرار«15» وەرناگرێ.
ساڵی دوو کڵمت کەڵبەی فیل
کورت هێنانی بۆجەکەی پڕ دەکەنەوە.
کابرا باڵویزی هەیە..
گیرفانی رەشیان
بەچوارمێخی زێڕکوت نەخشێنراوە.
سەربازەکانیشی بەشەڵواری کوڵەوە..
ئەو چاو لەدەستی ئەوانەو

ئەوان چاو لەدەستی ئەو..
تارانتابابۆ!
پاپا (پی) یازدەمینم دی!!
خاتوونێکی ئازاد لە بەهەشتی ئیتاڵیادا
لێوی بە کەف و کوڵێکی رەسمییەوە دەفرۆشێ..
نیو سەعاتیش بەنیو لیرە پاڵ دەکەوێ.
نیوەی نیو لیرەشی داوە
وێنەی مەسیحی دەستخستووەو
لەژوور سەری هەڵواسیوە.
تاکو پاپا لە گوناهەکانی لەش خۆش بێ..
تەماشام کرد:
ئەو لە بەرێزان (سان پیرو)
(جۆرج) ناکات.
ئەوان ردێنیان درێژو پڕ بوو
چ چاویلکەی زێرکوتیشیان لەچاو نەبوو..
ئەمەیان ریشی درێژو پەشتراو نییە
بەڵام چاویلکەی زێرکوتی لەچاودایە.



پاپا (پی) یازدەمینم دی تارانتابابۆ!
پی یازدەمین
لەشوانێک دەچێ
مەڕە رەشکەی خوری نەرم بلەوەڕێنێ.
ئەو گیانانیش
لە کێڵگەی پاشا بێ تانج و تاجدارەکان دەلەوەڕێنێ..
پی یازدەمین،
وەکیلی ئەوانەیشە، بێ باوک
لە ئاخوڕان لەدایکبوون..
جا بۆ ئەوەی لەمەریەم نزیک بێتەوە،
ئەو زەحمەتە دەکێشێ و
هەموو شەوێ
لە کۆشک و تەلارێکی
ئەستووندە مەرمەڕدا دەنوێ!!






**نامەی**
**چوارەم**

تارانتابابۆ!
بەناوبانگە..
فاشیایەتی ئیتاڵیا بەناوبانگە.
وەکو شاڵە ئاوریشمینەکانی
کە خۆری لە نەخشەکاندا دێتە سەما..
تلی ئێسترە رەشکەکانی
رێگەو بانەکانی پۆمپی
لا تێر ناکەی
لە سندووقە رەنگاورەنگەکەیدا
دڵی مێژووی لێدەدا..
بەقەد ناوبانگی سپاگێیتی بەناوبانگە.

فاشیایەتی لە ئیتاڵیا
نوورێکە
لە دارعەسای کۆنتە خاوەن
زەویوزارە گەورەکان و
قاسەی ئاسنینی رۆماییبە بانقدارەکانەوە
کەوتۆتەوەو
لە سەرە رووتاوەکەی دۆتچی «16» چەقیوە..



تارانتابابۆ
ئەو نوورە سبەی
بەسەر گۆڕستانەکانی
نێو دەشتەکانی حەبەشستاندا دەبارێ.



# نامەی پێنجەم



**نامەی**
**پێنجەم**

هێی
تارانتابابۆ.. هێی..
ژیان... چەند خۆشە..
هۆ له داێت...
دیتن..
بیستن
هەست کردن..
سەر ئاسوودە راکردن..
بیرکردنەوە..
قسەکردن..

بەبیرت بێمەوە
باسکم لە قاڵچە پان و پۆڕەکەت،
کە سێ منداڵی بۆ هێنای.. وەردابوو
بەگەرمییەوە یادم بکە
خوڕەی ئاوێک رووت و قووتت بێتەوە بیر
کە دەتکێتە سەر تاشەبەردێکی رەشەوە
ناوو گۆشت و رەنگی
ئەو میوەیەت بێتەوە بیر..
ئەو خۆرە سوورەی
تامەکەی لە چاوتایە.. وەبیربێتەوە..
ئەو هەیڤە شەوەت بێتەوە بیر
کە وەک گوڵێکی شینی مەزن وابوو
تامی ئا ئەو شتانەت بێتەوە بەرچاو..



بیربکەوە تارانتابابۆ!
دڵ و هۆش و بازووی مرۆڤ
لەناخی حەفتەمین قاتی زەمینەوە
خوداوەندی پۆڵاییینی چاوئاگراوی وایان
دەرکێشاوەو دروست کردووە
کە دەتوانن خاکەڕەشی زەمین
بەتاقە مشتەکۆڵەیەک بپرژێنن..
ئەو دار هەنارەی هەنارێکی دەگرت
ئێستاکە دەتوانێ هەزار بگرێ.
دنیا هێندە گەورەیە، هێندە گەورەیە
کەنار دەریاکان هێندە بێ سنوور.
کە هەموو شەوێ لەپات یەکدی
لەسەر لە ورشەدارەکان رابکشێین
دەتوانین گوێمان لە سروودی
ئاوە ورشەدارەکان بێ..

ژیان.
چەند جوانە تارانتابابۆ
چەند جوانە...
وەک تێگەیشتنی کتێبێکی چاک
وەک شڵەژانی مناڵێ
وەکو هەستی سترانەکی عیشق
وێنەی ژیان..

بژین؟
یەک یەک؟
تاکە تاکە؟
یان هەموومان پێکەوە؟
وەک بافتی قوماشی ئاوریشمین
وەک خوێندنەوەی داستانێ بەتام
هەموو بەیەک زار..
ژیان..
.......
.......



ژیان...
ئای کە سەیرە!
کچێ ئەوە چییە تارانتابابۆ ؟؟
(ئەو شتە جوانەی لە بڕوا بەدەرە)
ئەمڕۆ ئەمە
ئەم شتە جوانەی نایێتە گۆتن
چەند ئەستەم و چەند تەنگ
چەند خوێناوی
چەند بێ قیمەت..



## نامەی شەشەم



**نامەی**
**شەشەم**

نووسەران لێرە سێ پۆلن تارانتابابۆ.

پۆلێکیان وەک (دانۆنزیۆ) کە تاجێگی شەش چوکلەیی«[17]» نەک هەر لەسەر جلەکانی ناوەوەی، بەڵکو لەسەر پەڕەی دڵیشیا نەخشاندوو، لە دەسرۆکێکی ئاورویشم دەچێ.

یان (براندیللۆ) کە گومانی لە هەموو شتێک هەیە، لە چەنگی دۆتچی و پاداشتی نۆبلی خاوەنی دینامێت و (مارتینی) شێت و شوور نەبێ.

ئەوانەن وەچەی بلیمەتەکانی ئەدەبیاتی فاشست تارانتابابۆ.
ئەوانە وەک خـوداوەند دەدوێن، نووسـینەکـانیـان داخـراوو بەرزو تاریکستانێکە کەس نایگاتێ..
قوولە لە توانادا نییە کەس بچێتە ناویەوە..
وەلێ کـە ژانەزگ تـووشی تۆ دەبێ، ئەوانیش وەکـو تۆ تـووشی دەبن.. وەکو منیش برسی دەبم، برسی دەبن.. ئەمما ژیانیان وەک ژیانی خاوەن کارخـانەکانی قوماشی خوری میـلانۆ، یان ژیانی سەرۆک میرنشینێکی کۆن وایە کە تراکتۆری لە زەوییە کاکی بە کاکییەکاندا دەسووڕێنەوە.

ئەوانەن وەچەی بلیمەتەکانی ئەدەبیاتی فاشست تارانتابابۆ..
ئەوانـەن ئەو هێـزە دینامـیکیـەی شەڕ پەیدا دەکـەن، تا قـالبـە زێڕی. پارچە خۆر ئاسا، لە ناخی خاکی رەشمانەوە دەربێنن و لە قـاسـە پۆلایینەکـانی بانقـی (کـۆمـارچیـالـی) بئـاخنن. تاوەکـو دەمـاری مـلان لە بیابانە زەرد هەڵگەڕاوەکـاندا، لەژێر ئاسمـانی شینی ئیتالیادا وەک ئاوی دەریای ناوەڕاست ببڕنەوە.
گۆیا ئەوانە ئەدەبیش بە ژیان تێدەگەن.
چەهرەی ئەو نووسەرە ئیتـالیـانەم بینی کە پۆلێک لەو سێ پۆلە پێکدێـنن، وەک سێ پـارچـە زەوی کـــــە بـە سێ رووبـاران دابەشکرابن.
وێنە رتووش کراوەکانیانم دی لە رۆژنامەکاندا چاپکرابوون..



تەنها لەرێی کتێبەکانیشیانەوە قسەم لەگەڵ کردوون..
بەڵام برێ دووەمی نووسەرە ئیتالییەکان، ئەوە لەگەڵ هەندێکیان بەرەو روو دانیشتووم و قسەم لەگەڵ کردوون، دەستەکانیشم کە گـەرمـایی شـەوێکی ئەفـریقـایان پێوەیە، بەر پەنجە سـاردو زەرد هەڵگەڕاوەکـانیـان کەوتووە، کە وەک ئەو مۆمە (شوش)ـانە وان لەبەر وێنەی رۆشنی مەریەم دادەنرێن.
یەکێکیان لەناوبوو تارانتـابابۆ، چاوی بەچاوی سەگێک دەچوو، تـووشی هـاری بـووبێ و لەتـاریـکـایـی ئەشـکـەوتێـکی چـکـۆلـەو شێداری نێو چیایاندا تۆپی بێ.
سەبارەت بەوەی بەرگەی گەرماو تاوی هاوینانی نەگرتووە..
شاعیرو رۆماننووس و رووناکبیریش بوو تارانتابابۆ!
بەڵام ئەو قەلەندەرە پێش هەموو شتێک فێرە کۆکاین بوو.
جـاروبـار لەگـەڵ برادەرەکـانیـدا لەشـوێنێک دەمـدیتن کـە هەم مـەیخـانە بوو هەم لۆقنتـە.. دەنگی بەرز دەئاخـڤین.. بەشـەڕ دەهاتن، تەنـانـەت لاوێک شـــووشـــە شـــەرابێکی لەســـەری برادەرەکـەمـانـدا شکاند، ئەویش لە گـفـتـوگـۆیەکی گـەرم و زانسـتیـانەو قـوولـی نێـوانیـان لەسـەر ئەوەی کـامیـان بـگرتن، مەسیح یان کۆنفۆشیۆس؟!!
داخۆ ئەو کابرایە فاشی بوو؟ بەتەواوی نەء!
دیموکراتی بوو؟ بەتەواوی نەء.
وەک چۆن کۆکـاینیش لەشی تێک تەپاندبوو، هۆشی تێک تەپی

بوو، تەنیا تاقە شتکی راستی تێدابوو، تارانتابابۆ قەلەندەرو وڕو نموونەیەک بوو لە تێکەڵ و پێکەڵی.. وەک درەختێک رەگ و ڕیشەی وشک بووبن.

دوژمنی فاشیایەتی بوو، بەڵام دیاربوو دەیانگوت بەنهێنی (پڕی کردووەتەوە....) نازانم داخۆ ئەوە راستە یان نا؟ ئەمما شتێک کە خۆی بەنێو جەرگەی گەردوون دابنێ، ئەڵبەتە لەکردنی هەر کارێکیش ناسڵەمێتەوە.. ئەویش لەو تەرزانەبوو.

جا بۆ ئەوەی لەوەیشت باخەبەرکەم کە ئەو پۆلەی نووسەرە فاشستەکانی ئیتاڵیا چ دەنووسن، شیعرێکت بۆ لێرە دەنووسمەوە کە کوڕێکی نێو ئەو کوڕانە لەو شوێنە دەبەسترێن کە نیوەی مەیخانەو نیوەکەی دی لۆقنتەبوو، خوێندرایەوە.

ئەو شەوە هەموویان لەوێ بوون، زیافەتێکی گەورە لە شەرافەتی نووسەرێکی پیر کرابوو، ناکاو ئەو برادەرەمان بە سەرخۆشی لەجێی خۆی هەستا، کەیل ببوو زمانی گۆی نەدەکرد.

چەند هەنگاوێک چووە پێشەوەو گوتی:

- لەدوا کتێبمدا ئەوەندەی ئێستا بەبیرم بێتەوە بۆ تانی دەخوێنمەوە، ئینجا دەستی بەخوێندنەوەی ئەم شیعرە کرد، لەکاتێکدا هێڵی فراوانی بەدەستەکانییەوە لەهەوادا دروست دەکردن:



## کوێر

چەند خۆشە مرۆڤ کوێربێ
تاریکایی خۆشویستن چەند خۆشە
نەتیشکی وەک،
شمشیری رووت..
نەقورسایی رەنگان و
شپرێوی شرۆشکلان..
تاریکایی خۆشویستن چەند خۆشە
چەند خۆشە مرۆڤ کوێربێ.
چاوە نوقاوەکانت
بەرەو قەڵای ناخت دەبنەوە
لەکەنارەوە تەماشای
ئەو دەریایە دەکەن، لەناو دڵتان شەپۆل دەدات..
کوێربوون چەند شتێکی خۆشە
هەر کوێرەکان لەخەڵوەتا دەمێننەوە..
نەهیچ لەچاویان بەکەس دەبەخشن
نە لەچاوی کەس هیچ وەردەگرن..
هەر کوێرەکان لە خەڵوەتا دەمێننەوە..
تاریکایی خۆشویستن چەند خۆشە
تاریکایی وەک خوا وایە تاکو تەنیا
تاریکایی وەکو مەرگە
رەنگی نییە
سەنگی نییە
دەنگی نییە تاریکایی.
کوێرەکان!
پەرتی کەن بە گۆچانەکانتان
ئاپۆڕەی پێغەمبەرانی تاریکی..
مرۆڤ کوێربێ چەند خۆشە
تاریکایی خۆشویستن چەند خۆشە..!!

هۆنراوەکە تەواوبوو، چەپڵەیان بۆ لێدا..

ئەویش لابەلا دەچوو، وەک نیگارکێشێکیش ماوەیەکی زۆر بێ دیوارێکی سپی بەوێنەی رەنگاوڕەنگ نەخشاندبێ، ماندووببوو، هاتە سەر مێزەکەی تەک مێزی ئێمە، لەگەڵ رۆماننووسە پیرەکەی زیافەتی بۆکرابوو دانیشت..

نیگارکێشێک وەختی نیگارکێشانی نییە، چونکە خەریکی لەخشتەبردنی مۆدێلەکانییەتی.

کە هۆنراوەکە تەواوبوو، نیگارکێشەکە سەری لەبن گوێی رۆماننووسەکە ناو بە تەوسێکەوە وتی: چۆن بوو؟، دەڵێن ئەو شیعرەی لە شاعیرێکی فەرەنساییەوە دزیوە!؟ رۆماننووسەکە یەکسەر وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو نەختێ بیری کردەوە.. پاشان گوتی:

– بیستوومە ئەوەی شیعرەکەی خوێندەوە نزیکترین برادەرتە؟

– برادەرایەتی؟

نیگارکێشەکە بەپێکەنینەوە وەڵامی دایەوە، بەڵام مشتی وەک دەستی دوژمندار بەمشتووی چەقۆوە توندکردبوو!



بۆ درۆ بکەم تارانتابابۆ؟ من لەچۆنیەتی ئەو برادەرایەتییە نەگەیشتم.. داخۆ هەر بە تەنیا لە ئیتاڵیای فاشستدا وایە، یاخود لە تەواوی ئەوروپاییێشدا هەر بەو جۆرەیە؟

**تێبینی: رەشنووسەکانی نامەی شەشەم لێرەدا تەواو دەبێ. ئاشکرایە کە ناتەواوە.. جا بۆ ئەوەی بیروڕای لاوە حەبەشییەکە دەربارەی پۆلی سێیەمی نووسەرانی ئیتاڵیا بزانم، ئامادەبووم زمانی ئیتاڵی بەتەواوی لەبیر بکەم و جارێکی تر بگەڕێمەوە سەری و فێری ببمەوە.**



نامەی حەوتەم



**نامەی**
**حەفتەم**

من دەزانم
ئەو پرسانەی لەسەر رەفەی هۆشتەوە
وەک چەند شووشەیەکی سەرمۆر ریز کراون
لە پێنج، لە شەش تێناپەڕن..
تۆی وەک پرۆفیسۆرێکی یاسای نێودەوڵەتان
نەخوێندەوارو کوێرەوار
سەرت لەهیچ دەرناچێ..
سەرەڕای ئەوەش،
ئەگەر لێت بپرسم، بڵێم:

گەر تیسکی درێژی مەرەزی بزنەکەمان وەری
شیری بە هەردوو گوانەوە
وەک دوو باسکە تیرێژ چکیان کرد
پرتەقاڵمان بەسەر چڵەکانییەوە
وەک کۆمەڵێک وردە هەتاوی کوژراوە
وشک هەڵاتن...
یان گەر گرانی بەقاچی هێسک و پروسکییەوە،
وەک شاخۆمانەیەک
بەسەر خاکمان تێپەڕی.
گەلۆ، چیت کرد؟
تۆیش پێم دەڵێی:
«وەک شەوێکی بە ئەستێرە
چۆن لە تاریکەو لێڵەدا
دەست بەسپی بوونەوە دەکات
منیش تنۆک تنۆک ڕەنگم
دادەپچکوڕێ و دەژاکێم..»



پێم دەڵێی:
جا توخوا ئەم پرسیارانە
«لە ژنێکی ئەفریقاییەوە دەکرێ؟
نەهاتیی بۆ ئێمەمانان مردنە
هاتیش خۆشەویستی..»

بەڵام داخۆ چ پەندێک لەمەدایە تارانتابابۆ!
کار لێرە تەواو ئاوەژووە..
لێرە دنیایەکی سەیرە
بەڕادەیەک،
بەهاتی دەمرێ و
بە قاتی دەژی..!!
خەڵکی وەکو گەلەگورگی برسی و نەخۆش
لەکۆڵانان دەخولێنەوە.
عەمبارەکان پڕن لە گەنم و
کلیل دراون..
کارخانەکانی تەون
دەتوانن قوماشی ئاوریشم
بایی پۆشینی ئەو ڕێیەی
لە زەوی ڕا بۆ رۆژ دەچێ بهۆننەوە..

خەڵکی رووتن..
پێخواسن..
ئای کە لێرە دونیایەکی سەمەرەیە
ماسی قاوەی تێدا دەخۆنەوە
منالێش شیری دەست ناکەوێ..
لێرە خەڵکی بەقسە بەخێو دەکەن
بەرازیش بە پەتاتە..



**نامەی**
**هەشتەم**

مۆسۆلینی زۆر چەنە لێدەدا تارانتابابۆ!
لەبەر خۆیەوە:
بەتاقی تەنیا
وەک منداڵێک دەقیژێنێ
بەتەنیا لە تاریکیا فڕێ درابێ..
مۆسۆلینی لە دەنگی خۆی بەئاگادێ.
ترسێکی زۆری لێ نیشتووە...
هەر بەو ترسەیش دەسووتێ.
بێ پسانەوە دەڕیسێ...
مۆسۆلینی تارانتابابۆ قسان زۆر دەکات
جا چونکێ ترسێکی زۆری لێ نیشتووە
بەبێ ئەوەی گوێ بداتە کەس
هەر دەڕیسێ..

**نامەی**
**نۆیەم**

**تێبینی: سەرەتای ئەم نامەیە وێنەی (رادیۆ)یەکی پێوەبوو.**

ئەمڕۆ
وێنەیەکی بێ نووسینم بەخەیاڵدا هات تارانتابابۆ!
تابلێیی بەتاسەوە بووم
نەک بۆ دێم
یان چاوەکانت
بۆ دەنگت تارانتابابۆ
دەنگی فێنکت وەک نیلی شین
قووڵ وەک چاوی پڵنگێکی بریندار..!

**تێبینی: لەم راستەدا نامەکە ئەم هەواڵەی پێوە لکێندراوە کە لە یەکێک لە رۆژنامەکانەوە بڕراوە.**



* مارکۆنی «18» پیاوی سەر راستی دۆتچی
مارکۆنی بە رۆژنامەنووسانی گوتووە:
«من بەرفەرمانی سەرۆکی خۆم مۆسۆلینیم.»
ئەو مارکۆنییەی تیشکێکی مەرگی داهێناو، یەکەمین تاقیکردنەوەیشی بەسەرکەوتوویی لە حەبەشەدا ئەنجامدا.
ئەم تیشکە، دەستی هەیە
وەک باڵندەی باڵ شینکەڵەی بەرەڵڵا
دەنگ دەنێرێتە ئاسمان و
لە ئاسمانیشەوە جوان جوان
خۆشترین ستران
وەکو میوەی پێگەییو
کۆدەکاتەوە..
دەستەکانم،
ئەوەی لە خزمەتی بنیتۆی کراس ڕەشدا
بەردەوام دەبن
تا ئانیشکێ دەچنە خوێنی براکانم..
ملیۆنێری نەقۆڵا کۆنت مارکۆنی
خاوەنی قەباڵەی بانقی بازرگانی
زانای مەزن، مارکۆنی
لە دەشتاییەکانی حەبەشستاندا دەکوژێ..

**نامەی**
**دەیەم**

**تێبینی: سەرەتای ئەم نامەیەیش، ئەم هەواڵەی پێوەبوو کە لە ڕۆژنامەیەک دەرهێنرابوو و بەبروسکە نێردرابوو:**
**«هێـزەکـانی ئیـتـاڵیـا ، چاوەڕێی باران وەشـان و هاتنی بەهار دەکـەن تا چالاکییەکانیان لە حەبەشەدا دەست پێبکەنەوە» .**

کارێکی چەند سەیرە تارانتابابۆ
بۆ ئەوەی لە وڵاتی خۆمان بمانکوژن
چاوەڕێی هاتنی بەهاری خاکمان دەکەن.
کارێکی چەند سەیرە تارانتابابۆ
ئەگەر ئەمساڵ
باران لە ئەفریقیا نەبارێ و
بارانی ڕەنگ و بۆن
کێشمانی خاکی شێدارو بەروەرۆژمان نەدا
چوون ژنێکی گالیایی توج ئارایشت
لەبەر ڕۆژێ کێشمانی خۆی دەدا..
لەوانەیە لەگەڵ مەرگدا
بەروبوومی بەلەزەتمان بۆ بهێنێ..
وەک مەمکی بەلەزەتی تۆ..
کارێکی چەند سەیرە تارانتابابۆ!
مەرگ لە دەرگای ئێمەوە دێتە ژوورێ،
گوڵێکی بەهاریشی.
لە شەپقەی بۆنداری داوە..



**نامەی**
**یازدەم**

ئەمشەو دۆتچی
بەسواری ئەسپێکی بۆر
لەنێو پێنج سەد فڕۆکەوان
خوتبەی دەدا..
خوتبەکەی تەواوبوو
سبەی ئەوان بەرەو ئەفریقایێ دەچن.
ئەویش ئەمشەو
گەڕایەوە کۆشکەکەی
سپاگێتی بەساڵچە بخوات.



## نامەی دوازدەم



**نامەی**
**دوازدەم**

وادێن بتکوژن تارانتابابۆ
وادێن تا سکت هەڵدڕن و
ریخۆڵەکانت ببینن
کە وەک چەند مارێکی برسی
لەسەر لم لوولیان خواردووە.
وادێن خۆت و بزنەکەت بکوژن
کەچی نەدەتناسن و
نە تۆش ئەوان دەناسی..
نە بزنەکەت پەرژینی
بێستانەکانیانی بەزاندووە

وادێن تارانتابابۆ
هێندێ لە ناپۆلییەوە
هێندێ لە تیرۆلەوە
هەندێکیان لە چەند نیگایەکی پڕ حەزو
چەند دەستێ گەرم ناسکتر
هێندێ، پاپۆڕی لە سێ دەریاوە هاتوو
تاک، تاک و
دەستە دەستەو
پۆل پۆل
وەک بۆ شایی هێنابن
بۆ مردنی هێناون..

وادێن تارانتابابۆ
لەنێو کلێپەی ئاگرێکی گڕگرتوودا
ئاڵآیان لەسەربانی خانووە قوڕەکەت بچەقێنن.
ئەوانەی دێن
بێتو بشگەڕێنەوە
جارێکی دی
نە تۆڕنەچی
کە باسکی راستی لە خوێن سوورەوە پەڕیوە



دەتوانێ شیشە ئاسنان وەک ئاوریشم بهۆنێتەوە،
نە ماسی گری سقلیایی
بەهەردوو چاوی کوێرییەوە،
لە توانای دایە رۆشنایی
دەریایەکانی ببینێ..
وادێن تارانتابابۆ
خۆ گەر ئەوانەی بۆ مردن و
کوشتن ناردراون
ئەو رۆژی دەگەڕێنەوە
ئەوا خاچی تەنەکەیان
یەکە یەکە
لەپێچەکی خوێناویا دراوە..
ئەوسا نرخی قەواڵەو کۆمپیالە
لە رۆمای مەزن و دادوەردا هەڵدەکشێ..
دوای کۆچکردنی ئەوانیش
ئاغا نوێیەکانمان دێن
مردووەکانمان رووت کەنەوە.






**دوا نامه**

تارانتابابۆ!

لەوانەیە ئەمە دوا نامەم بێ بۆت..

ڕێی تێدەچێ، جارێکی دی پێک نەگەینەوە..

دەشێ لوولەی ئەو تفەنگانەی گوللەبارانی من دەکەن و لە بێنم دەبەن..

بۆ مەمکی تۆیش ئاراستە بکرێن،

تا کونی سوور سووری تێ بکەن..

لەم نامەیەدا کە دوا نامەیە ئەو تیلمانەت بۆ دەنێرم کە لە هەندێ رۆژنامەی ئیتاڵیم کردوونەتەوە، لەگەڵ دوو سەرژمێر کە لە رۆژنامەیەکی ئەوروپایم وەرگرتوون، تاکو ئەوەت بۆ روون بکەمەوە قسەی زل لەکوێ و سەرژمێری ورد لە کوێ..

سەرژمێرەکان ئەوەتان لە دامێنی نامەکەدان، ئێستاش لە تیلمەکانەوە دەست پێدەکەم:

*** برگەیەک لەو نامەیەی دانونزیۆ**
**بۆ کلاودیۆی بەگزادەی نووسیوە:**

«مییۆکارۆ ئەمیگۆ«19»
وردەواڵە دەگمەنەکانم وەرگرتن،
وەرو کاسم، بەڵام لەوانەیە پێش جێژنی پیرۆز بتبینم.
وەک جارانیش دەسرۆکە تەنکەکانم پێ باشترە..
تۆ توورەم دەکەی، تریکۆ پەمپەکانت بۆ دەنێرمەوە،
رەنگەکانی نارەحەتم دەکەن.
هەمیشە بۆرو سپی سەدەفی و شینی کاڵم
بۆ بنێرە.!!



**** شەرو تەندروستی***

بیست و شەش ساڵە ئێمە ئەوە رادەگەیێنن، کە شەڕ چەند پێویستە!! چونکە لەشی مرۆڤ لاو دەکاتەوەو گیانی پاک دەکاتەوە.

لە بەیاننامەی مارینتیبیەوە.

* ئەوانەی لەشەڕی پێشوودا کوێربوون

ئەوانەی لەشەڕەکانی پێشوودا کوێربوون دەتوانرێ ئێستا لە تیپەکانی دژی ئاسمانی سوودیان لێوەربگیرێ، چونکە بەهۆی گوێ سووکیانەوە، بە وردی دەنگی فڕۆکەکان لێک جیادەکەنەوە بەم جۆرە دەیانهێنینە بەر رووناکی.

**لە رۆژنامەی «کوبر دیلاسیرا»وە**

* ناگەڕێینەوە

ئیتر ناگەڕێینەوە،
سەد هەزار تفەنگی ئیتاڵیایی گوللەیان
لە ئەفریقایێدا لەخۆڕا دەتەقێتەوە.

**لەراگەیاندنێکی دۆتچی**
**بۆ نووسەری رۆژنامەی «دێلی میل»**



### * دە (10) فەرمان بۆ کراس ڕەشەکان

ئەم (10) فەرمانە لە ئاهەنگێکی گەورەدا بەکراس رەشەکان راگەیێنرا:

**1**- سەرکەوتنی کراس رەشە چەکدارەکانی ئەودیوی سنووری نیشتمان، سەرکەوتنی شارستانیەت و گەڕانەوەی عەدالەتی مرۆڤایەتییە بۆ جێی لایەنی خۆی.

**2**- هەر کەسێ بیەوێ لەرێی عەدالەت و شارستانیەتدا بڕوات دەبێ ئامادەی ئەوەبێ ژینی لەپێناودا بدات.

**3**- ئەو خۆبەختکردنەی وەختی گەرمبوونی شەڕ لەسەر بڕوای بێ پایانی نووشستی دوژمنەوە دەوەستێ.

4- بڕوای راستەقینە لەکاتی نەبەردیدا دەردەکەوێ، بەڵام ئەمە بەس نییە، چونکە دەرکەوتنی ئەو بڕوایە لە وەختی ئازاری چاوەڕوانیشەوە پێویستە.

**5**- بڕوات پێ بێ، بەرفەرمان بە، شەڕ بکە.

بڕوای پێ بێنە، چونکە تۆ دەزانی دۆتچی هەمیشە راست دەکات، بەرفەرمان بە، چونکە دەزانی هەموو فەرمانێک لەوەوە دەردەچێ، شەڕبکە، چونکە دەزانی هەموو شەڕێک ئەو پێشەوای بێ سەرکەوتووە.

**6**- دوژمن ناتوانێ لە غەفڵەتەوە پاریزتان لێوەربگرێ، چونکە کراس ڕەشەکان چاویان لە تاریکیشدا دەبینێ.

**7**- دوژمن ناتوانێ سوود لە تەنگاویە مادییەکانی کراس ڕەشان ببینێ، چونکە گیانێکی وایان هەیە مادده هەڵدەلووشێ.

**8**- کەسێ زۆر بە تەنگ چەکەکەیەوە نەبێ، یان گوللەیەک ون بکات و لە یەکەم تاوی تینوویەتیا پەنا بۆ مەتارەکەی ببات، ئەوە لە کراس ڕەشان نییەو بێ دەسەڵاتەو شایەستەی ژیان نییە.

**9**- ئەگەر لەکاتی شەڕدا پەیوەندی بەهێزە سەرەکییەکەوە بڕا، نابێ چاوەڕێی هیچ فەرمانێک بکات فەرمان هەر ئەوەیە:

«بۆ پێشەوە.. هەمیشە بۆ پێشەوە».

**10**- کراس ڕەشەکان لەگەڵ یەکەمین ڕێژنەی گوللەدا وێنەی دۆتچی مەزن دەبینن کە لەسەر رووی ئاسمان وەک خەیاڵی پاڵەوانێکی ئەفسانەیی، لە خەونێکی قارەمانییەتیدا کێشراوە.

### ***سەرژمێرەکان***

**ئەم سەرژمێرە بەم چەشنە دەخوێندرێتەوە کە رێژەی کرێی کرێکاری ئینگلیز 100%.**

لە ئەمریکا..............120%
لە کەنەدا ...............100%
لە ئینگلستان............100%
لە ئێرلەندا...............80%
لە هۆڵەندا...............72%
لە پۆڵۆنیا................50%
لە ئیسپانیا..............30%
لە ئیتاڵیا................29%



### ***بێکاری و مایەپووچی لە ئیتاڵیا***

لەساڵی 1929دا_____ 300,786 **بێکار** 1204 **نەدار**
لەساڵی 1930دا_____425,437 **بێکار** 1297 **نەدار**
لەساڵی 1931دا_____731,437 **بێکار** 1786 **نەدار**
لەساڵی 1932دا_____932,291 **بێکار** 1830 **نەدار**

ئەم ژمارانە دەسکەوتی دە ساتی فاشیایەتین تارانتابابۆ..

داخۆ لەساڵانی دوای ئەوان ساڵانە چی بووبێ؟

ئەم پرسیارە ئەو لاوە ئیتاڵیانە وەڵامی دەدەنەوە کە لە خاکەکەماندا دەکوژرێن.

## پەراوێزەکان

**1–** کۆلسیۆم: پەیژەبەندێکی گەورەی بازنەییە لە رۆما، جێی سەد هەزار کەسی تێدا دەبێتەوە، ڤسباسیانسی ئیمپراتۆر دروستی کرد، ئێستاش شوێنەواری ماوە.-(و.کوردی)

**2–** کارتیری پۆپۆلاری: بەزمانی ئیتالی واتە گەڕەکە میللییەکان.

**3–** کۆنت شیانۆ: وەزیری دەرەوەی ئیتالیا بووە لەنێوان سالآنی (1944-1936).

**4–** مەبەست لە مۆسۆلینییە.-(و.کوردی).

**5–** ئەفسانەی دامەزراندنی شاری رۆما، بەو کێشەیەوە دەستی پێکرد کە سەبارەت بە تەختی پاشایەتی نێوان ئالبا– Alba– نۆمیتۆر –Numitor پاشاو ئامولیوسی Amuliusی برای.

ئامولیۆس دەباتەوەو نۆمیتۆری برای دەخاتە بەندیخانە جا بۆ ئەوەی لەمیراتی



بێبەش بکات، پاڵ بە (ریاسیلیڤیا)ی کچی نۆمیتۆرەوە دەنێ ببێتە (راهیبە)ی خوداوەند ڤێستاو لە شووکردن بێبەشی بکات.

خوداوەند (مارس)یش لە خەونا سلیڤیا زەوت دەکات و سکی پڕ دەبێ، ئۆمیلۆسی مامی دێ لە قەڵایەکدا دەیخاتە زیندان، مناڵە جمکەکانیشی داوێتە رووباری (تێبر)، ناکاو ئاوی رووبار دەکشێتەوەو منداڵەکان داوێتەوە کەنار.

گورگێک کە بێچووەکانی ونکردووە دێتە ئەوێ و شیری خۆیان دەداتێ، بەرێکەوت شوانێکیان دەگاتێ ناوی (ڤاوستۆلۆسە) مەلۆتکەکان دەباتە لای (لارینتای) ژنی، ئەویش پەروەردەیان دەکات تاکو پێ دەگرن.

پاشان رۆژێ رمۆس هێرش دەباتە سەر شوانکارەکانی رانی ئامولیۆس پاشا کە لەسەر گردی (ئاڤێنیتۆس– Aventinues) دا دەیان لەوەڕاند.

شوانەکان رمۆس دەگرن و بۆ لای پاشای دەبەن، لەو کاتەدا رمۆلۆس کە ئەو دەم لەوێ نابێ دەگەڕێتەوە، بەهۆی (ڤاوستۆلۆسی) شوان زیندانی براکەی پێ دەزانێ، ئیتر دەم و دەست بەخۆی و بەکۆمەڵێک لاوەوە هێرش دەبەن و باڵەخانەکە داگیر دەکەن و ئامۆلویۆس لادەبەن و لەجێی ئەو نۆمیتۆر دەکەن بە پاشا.

ئەو دوو برایە بۆ دامەزراندنی شارێکی تایبەت بەخۆیان لە ئالبادا نامێنن.

بەڵام کێشەیەکیان سەبارەت بە هەڵبژاردنی شوێنی شارەکە لەنێودا پەیدا دەبێ، ئینجا پەنا دەبەنە بەر تاقیکردنەوەی بەخت، نیشانەیش لە فڕینی باڵندانەوە دەردەکەوێ، رمۆس دەچێتە سەر گردی (ئاڤێنیتۆس)ەوە لەوێ شەش هەڵۆیان دەبینێ، وەلێ رمولۆس، لەسەر گردی (بلانتینۆس) دوازدەدان دەبینێ، ئەو دەباتەوەو مافی ئەوەی دەبێ شوێنی شارەکە دیاری بکات.

رمولۆس سنووری ئەو شوێنە دیار دەکات کە هەڵبژاردبووو و ئاگاداریش بڵاودەکاتەوە؛ هەر کەسێ ئەو سنوورە ببەزێنێ دەکوژرێ.

رمۆسیش کە بەهۆی سەرکەوتنی برایەکەوە خەم دای گرتبوو پێدەکەنی و بەسەر هێڵەکەدا باز دەدات، رمولۆسیش دەیکوژێ و خۆی بە تەنیا دەبێ بە فەرمانڕەواو بیر لەهۆیەک دەکاتەوە خەڵکی پێ لەشارەکە نیشتەجێ بکات، دێ پەناگەیەک لەسەر گردی (کاپیتۆلیۆم Capitolium) دادەمەزرێنێ، هەموو دزو جەردەو رێگرو تاوانبارو پیاوکوژان جێ ژیانیان تێدا دەبیننەوە.

رمولۆس خۆی دەکات بە پاشایان.

بەڵام دەگمنیی ژنانی لەنێویاندا گرفتێک بوو، حەسانەوەی لێ تێکدابوون، ئیتر رمولۆس پەنا دەباتە بەر فێڵێک و لە یەکێک لە جەژنەکاندا ئاهەنگێک ساز دەدات، سابینیەکانی هاوسێی تیا بانگ دەکات، ئەوانیش بێ چەک ئامادەی ئاهەنگەکەی دەبن، رمولۆس و پیاوەکانیشی هێرش دەبەنەسەر ژنەکانیان و دەیانرفێنن.
کە سابینیەکان بەچەکەوە دەگەڕێنەوە شەڕ لەگەڵ رمۆلۆس و پیاوەکانی بکەن، ژنە سابینیەکان دەکەونە بەین و بۆ ئەوەی نەهێڵن خوێن بکەوێتە بەینی باب و براو مێردەکانیان.
بەم جۆرە رۆمایی و سابینیەکان لەنێو خۆیاندا یەکیەتییەکی کۆنفیدراڵی دادەمەزرێنن، رمۆلۆس و تاتیۆس بەڕێوەی دەبەن، بەڵام لە دوایدا تاتیۆس دووچاری کوشتنێکی نامەردانە دەبێ.
مردنی رمۆلۆسیش سەرو سەربردەی زۆرن.
لە یەکێکیاندا وا هاتووە کە پاش ئەوەی ساڵی (754 پ.ز) رۆمای دامەزراند سی و سێ ساڵانی فەرمان گێڕا، پاشان رۆژێ کە سەربازەکانی لە مەیدانی (مارس)دا بەسەر دەکردنەوە رەشەبایەکی توند هەڵیکردو ئاسمان دای کردە بروسکەو باران. جا لەگەڵ دەست پێکردنی رەشەبادا، پاشا خۆی شاردووەتەوە، رۆمانیەک پاشای لە خەودا دیوە، بەدانیشتوانی رۆمای گوتبوو کە رۆمولۆس سەرکەوتووەتە ئاسمان چووەتە ریزی خوداوەندەکان و ناویشی (کرینۆس- Qur-rinus)ـە.
ئیتر لەوە بەدوا رۆماییەکان رمولۆسیان بەناوی (کریونۆس)ـەوە دەپەرست، پەرستگایەکی گەورەشیان لەسەر گردی (کرینالیس)ـەوە بۆ دروست کرد.
لە حیکایەتێکی تردا هاتووە، کە مردنی رۆمولۆس بەم پیرۆزییە نەبووە، بەڵکو ئەندامانی ئەنجومەنی ریش سپیان کە لە جەورو ستەمی رمولۆس بێزاربوون، وەختی هەڵکردنی ڕەشەباکە بواری کوشتنیان وەرگرت و ئەفسانەی خەون و کرینۆسیشیان بۆ هێمن کردنەوەو قایل کردنی گەل هەڵبەست.
6- بەزمانی ئیتاڵی لەباتی (.Mr) میستەری ئینگلیزییەوە بەکاردێ (و.کوردی).
7- وا دیارە بازاڕێک بووە لە حەبەشستان. (و.کوردی).



8- (مست وەشێن- ملاکم)ێکی بەناوبانگی ئیتاڵییە.
9- لە شاعیرە نەمرو مەزنەکانی ئیتاڵیایە- نووسەری شاکاری بەناوبانگ (کۆمیدیای خوداوەندی)یە (1265-1321).
10- ئەو ئافرەتەبوو دانتی حەزی لێدەکرد- (و.کوردی).
11- لە دەقە عەرەبییەکەو تورکییەکەشدا بە -کاتدرائیە- هاتووە. ئەڵبەتە کە وشەی کاتدرایش بەمانای کلێسەیەکی گەورەوە دێ. (و.کوردی).
12- بە واتای هەڵپەسێردراوە- (و.کوردی).
13- قراڵ- لەباتی قەیسەر.
14- واتە کوا رۆما؟ رۆما کوانێ؟-(و.کوردی).
15- چیایەکە لە حەبەشستان.
16- مەبەستی لە مۆسۆلینییە- (و.کوردی).
17- مەبەستی لە دروشمی فاشیایەتییە.
18- (1874-1934)- فیزیک زانێکی ئیتاڵییەو داهێنەری رادیۆو بێ تەلە.
19- بە زمانی ئیتاڵ بەواتا برادەری خۆشەویستم- (و.کوردی).

**تێبینی:**
**بۆ دەقی عەرەبی ئەم شیعرە بڕوانە ناظم حکمت- قصائد ملحمیە- وەرگێڕانی: عبدالوهاب الداقووقی- بڵاوکردنەوەی (الموسسة العربیة للدراسات والنشر- بێرووت-1980 ل (86-119).**

# هەوڵە چاپکراوەکان

***1) لەبواری لێکۆڵینەوەی رۆژنامەنووسیدا***

* رۆژنامەگەریی کوردی و رۆژنامەنووسی کورد
نامیلەکە-چاپی 1984، بەناوی خوازراوی
(پاکزاد محمد کریم)، چاپکردن و بڵاوکردنەوەی یەکێتی رۆژنامەنووسانی کوردستان(لەشاخ)
چاپی دووەم بەناوی سەریح، هەولێر چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، 1991
* پرۆژەیەک بۆ دەرکردنی رۆژنامەیەکی رۆژانە بەکوردی
لێکۆڵینەوە-گۆڤاری(رۆشنبیری نوێ) بەغدا، پایزی 1986
* هەڵەی چاپ، ئەمڕۆ ئاسۆی دوا رۆژ
لێکۆڵینەوە-بەدووبەش، رۆژنامەی (هاوکاری) بەغدا1988
* وێنەو کاریکاتێرو تایپۆگرافیاو بەکارهێنانیان لە رۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوە-بەسێ بەش، گۆڤاری (کاروان ژمارە 85و 86و 87)ی 1990.
* برایەتی: یەکەمین رۆژنامەی رۆژانە لە مێژووی رۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیا-چاپی یەکەم گۆڤاری(یەکگرتن) کە لە هەندەران دەردەچێ، چاپی دوەم چاپخانەی خەبات 1991. چاپی سێیەم چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر-1997.
* ئاژانسی دەنگوباسی کوردستان(ئاداک-ADAK)
پرۆژەی دامەزراندن و بەڕێوەبردن
لێکۆڵینەوە-رۆژنامەی (برایەتی) بەسێزدە ئەڵقە، هەولێر-1993، چاپی دووەم بە کتێب چاپخانەی خەبات دهۆک 1997
* درەختی بنکۆڵکراو:
پەنجەنمایێکی رۆژنامەنووسیانە بۆ باری رووناکبیری و کلتووری کوردی چاپی یەکەم کوردستان-1995، چاپی دووەم سوید 1996.
* چەند وتارو نووسینی تر هەر لەم بوارەدا لە شوێنی جیا جیا بە کوردی و عەرەبی.

***2) شیعر***

* ئەو شەوانەی خەون نایێ:
چاپخانەی (النعمان)نەجەف-1977
* تاڤگەی مەند
چاپخانەی (شفیق) بەغدا-1987

* چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی:
چاپی یەکەم- ئیتاڵیا -1994
چاپی دووەم- کوردستان- 1995

### *3) لەبواری وەرگێڕاندا*

* نووستوی بەر باران:
شیعر، چاپی یەکەم- چاپخانەی (علاء)بەغدا-1980
چاپی دووەم- کوردستان- 2005
* ڕێگاوبان
پێنج چیرۆکی درێژو شانۆنامەیەک لە نیکۆلای خایتۆڤەرە-چاپی یەکەم-
چاپخانەی (الحوادث) بەغدا-1983 بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی حەیدەری.
چاپی دووەم-کوردستان-2005-دەزگای موکریانی.
* سەرتاییەک بۆ تێگەیشتنی هونەری شێوەکاری
چاپی یەکەم- چاپخانەی(حسام) بەغدا 1986
چاپی دووەم- کوردستان- 2005-دەزگای موکریانی.
* چەند نامەیەک بۆ تارانتابابۆ:
شیعری نازم حیکمەت.
چاپی یەکەم-چاپخانەی (الزمان)بەغدا-1990.
چاپی دووەم- کتێبی ئەرزان- سوید-1996.
چاپی سێیەم- کوردستان-2005.
* دایکی کورد-دانییێل میتران
لە عەرەبییەوە 1996 - چاپخانەی خەبات-دهۆک.

### *4) کاری شێوەکاری (کۆلاژ)*

***پاییزی چاوەکان**
کۆلاژ لە تاراوگەی شیعردا -چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری-هەولێر 1998.
***چاوەکان.. هەمیشە چاوەکان...**
کڵاو رۆژنەیەک لە شەختەدا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری 1999
5) (شرفە) بە زمانی عەرەبی، چاپخانەی خەبات- دهۆک-1998.
6) بێجگە لە دەیان شیعری وەرگێڕدراو و نووسینی دیکەو گۆشەی جیا جیا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا لەکات و شوێنی جیاجیادا بەکوردی و عەرەبی.